تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
دارستانەکە
١٠
کۆمەڵە چیرۆکێکی منداڵان
ورچۆڵە
زۆر دەنوێ
منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
دانانی: واریس ئەلکەندی
وەرگێڕانی: سەرگوڵ عیزەت مستەفا
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور

## زۆر دەنوێ

ناوی کتێب: ورچولە زۆر دەنوێ
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: سەرگوڵ عیزەت مستەفا
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوەی: بوراق بۆ چاپ و بڵاکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: فیردۆس مونعیم
ڕەنگی ژمارەیی: مەلیحە حەسەن
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٥١-٠
چاپی یەکەم ٢٠١١


**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤٠٦)ساڵی ٢٠٠٩**
Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com

هەبوو نەبوو کەس لە
خوا گەورەتر نەبوو ...... ورچێکی
بچووک کە ناوی ورچۆڵە بوو لەگەڵ دایکیدا،
لە ماڵێکی جوانی دارستانە قەشەنگەکەدا دەژیا ....
ورچۆڵە ئەوەندەی یاری دەکرد ئەوەندەی
نەیدەخویند، بە شەو تا درەنگانێک ئەنووست و
بە ئێواران سەیری تەلەفیزیونی دەکرد، کاتێکیش
بەیانیان دایکی بانگی دەکرد، هە ڵسێ و بچێ بۆ
قوتابخانە زۆر درەنگ لە خەو هەڵدەستا و لە
کاتی قوتابخانە دوا دەکەوت.

رۆژێکیان ورچۆڵە زۆر درەنگ لە خەو هەڵسا، بە پەلە جلی قوتابخانەی لەبەرکرد و بە ڕاکردن بەرەو قوتابخانە بووەوە ... کە سەیری کرد بێچووی هەموو ئاژەڵەکان لە کاتی خویاندا هاتوون و لە پولدا دانیشتوون، بە شەرمەوە داوای لێ بوردنی کرد لە مامۆستاکەی، لەسەر تەختەکەی خوی دانیشت .... پاش چەند خولەکێک خەو گرتی و کەوتە پرخەپرخ، ئەڵبەتە شەو بە تەواوەتی نەنووستبوو .....

لەو خەوە قووڵ و
خوشەدا، مامۆستا بە نارەزاییەوە نزیکی
کەوتەوە و بە دەنگێکی بەرز وتی ٤+٤ دەکاتە
چەند؟ ورچۆلە لە دەنگی مامۆستاکە بە ئاگا
هاتەوە و وتی ها،، ها،، چی،، لەکوێم،،،؟
هاورِییەکانی دایانە قاقای پێکەنیین و گاڵتەیان پێ کرد
مامۆستا وتی : بێدەنگ بن هەموو بێدەنگ بوون و
ڕووی کردە ورچۆلە و وتی: پەراوی ڕێنووسم نیشان بدە،،،،

ورچۆڵە جانتاکەی
کـردەوە وکەوتە گـەڕان، بەڵام
پەراوی ڕێنووسـی بەدی نەکرد، هەر
بۆیـە بـە مامۆسـتاکەی وت: زۆر داوای
لێبـوردن دەکـەم، درەنگ خەبەرم بـووەو و بە
پەلـە هاتـم، وا دیـارە پەراوەکەم لـە ماڵەوە لە
بیرچـووە،،،،!! مامۆسـتا بـە ناڕەزاییـەوە وتی:
هەمیشـە درەنگ دێیت و پەراوەکانت لە بیر
دەکەیت، سبەینێ دەبێ دایکت بێت تا قسەی
لەگەڵدا بکەم،،،،

ورچۆڵە دایە پرمەی
گریان و بە مامۆستای وت: تکایە
بمبەخشە ئەمەش دواجارە، مامۆستا هەستی
بە غەمباری کرد و نیگەران بوو بە نەرمی و
خۆشەویستییەوە وتی: بچکۆلەکەم مەگری،
ئەڵبەتە ئەگەر وانەکانت بخوێنیتەوە و
ئەرکەکانت زوو بەجێ بێنی و ماوەیەکی کەم
یاری بکەیت و لە کاتی شیاودا بنویت، وەک
هەموو منداڵێک... ئەوا بەیانیان زوو بە چالاکییەوە
هەڵدەستیت و لە پۆلدا نانویت، دەبێ کاتی خۆت
ڕێکخەیت.

کاتێک مامۆستا
قسەی بۆ ورچۆڵە دەکرد هەموان
گوێیان لە دەنگی قۆڕەقۆڕی ڕێخۆڵەکانی ورچۆڵە
دەگرت، هەموان بە دەنگێکی ئاشکرا دایانە قاقای
پێکەنیین، ورچۆڵە زۆر شەرمەزار بوو، مامۆستا بە زەردە
خەنەیەکەوە وتی، دەبێ ڕاسپاردەکەم بەجێ بێنی،، تەنانەت
دەبێ نانی بەیانیان بخۆیت، تا ئەو جۆرە دەنگە بەهۆی
برسێتییەوە لە سکتەوە نەیەت.

ورچۆڵە لە هەموو ڕاسپاردەکانی گەیشت و ئەوەی زانی کە
هەمویان بە هۆی کەم نوستنەوەیە، بە مامۆستای گوت: کە
چوومەوە وانەکانم دەنووسمەوە و لە پاشان تۆزی یاری دەکە
م و زوو دەنووم.. تا زوو هەڵسم و نانی بەیانی بخۆم و لەگەڵ
خوێندکاراندا لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بم، بەڵێنتان دەدەمێ.

ورچۆڵە
گەیشتەوە ماڵی و ڕووداوی ئەمڕۆی
بـۆ دایکی گێڕایەوە... دایکی بە زەردەخەنەیەکەوە وتی:
ئەڵبەتـە خۆدی خـۆت هەموو کێشـەکانت زانی و پێویسـتە
لەسـەرت ڕاسپاردەکانی مامۆسـتا بە سـۆزەکەت جێبەجێ
بکەیت و پابەندی بەڵێنەکەت بیت، ورچۆڵە بزەیەک گرتی و
دەسـتی کـرد بە نان خواردن و ئینجا هەمـوو ئەرکەکانی بە
شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت و جـوان ئەنجامدا و چووە
دەرێ بۆ یاریکردن لەگەڵ هاوڕێکانیدا..

گەڕایەوە دەست و دەموچاو و قاچی شت و دانیشت نانی ئێوارێی خوارد و ددانەکانی شت و لە نزیک دایکیەوە دانیشت سەیری تەلەفیزیۆنی کرد، پاش ماوەیەکی کەم دایکی پێی گوت ڕاسپاردەکانی مامۆستاکەت لەبیر نەکەیت، لە وەڵامدا وتی: باشە دایە دەچم بۆ نووستن.

ورچۆڵە چووە جێگاوە، بەڵام هەرچەندی کرد و کۆشا نەیتوانی زوو بنوێ دایکی پێی زانی و وتی: خەمت نەبێ ڕۆڵەکەم ئێستا دێم و حەکایەتێکی خۆشت بۆ دەگێڕمەوە، کاتێک کە گوێڕایەڵی ئەو چیرۆکە خۆشە بوو، هەستی بە خۆشی کرد، پێش ئەوەی حیکایەتەکە تەواو بێت خەو دایگرت و بەرە بەرە خەو بردیوە و بە هێمنی نووست.

بەیانی ڕۆژی ئاینده، دایکی بانگی لێکرد، زوو بە ئاگا هاتەوە، زۆر چالاکانە هەڵسا و دەست ودەم‌وچاوی شت و لە دەوری خوان دانیشت، نانی بەیانی خوارد، کوپی شیری کرد بەسەرا و ئینجا کتێب و پەراو و قەڵەم و پێداویستیەکانی لە جانتاکەدا ئامادە کرد و بە بزەیەکی ڕوون و هیواوە خواحافیزی لە دایکی کرد و بەو پەڕی شادییەوە بەرەو قوتابخانە بووەوە.

زۆر بـــە ڕێکـوپێکی و چالاکی و پاکیەوە خۆی کرد بە پۆلدا، کاتێک مامۆستا دی پێ خۆشحاڵ بوو، پێی گوت: مـــن خۆشـــحاڵم ورچۆڵەکەم جا گەر هەمـــوو ڕۆژێک ڕاســـپاردەکانم بەجێ بێنی، ئەوا زوو لـــە پۆلدا دەبی و تەنانەت خەو ناتگرێ و هەست بە برسێتی ناکەیت و لە ئەنجامدا نمرەی بەرز وە دەست دێنی، ورچۆڵە وتی: بەڵی مامۆستا، خوێندکارەکان گوێڕایەڵی قسەکانی بوون و بە پەرۆشەوە چەپڵەیان بۆ لێدا..

**ئەمە لەبەر کە**

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ

## ڕاوێژکاریی قەڵای بەرگری پەشیمانیە و پاراستنە لەگلەیی

دیمان ورچۆڵە چۆن نا ڕێک بوو، چەندیش ڕووبەڕووی هەڵوێستی ناخۆش بووەوە، چونکـە پابەنـدی ڕاسـپاردەکانی مامۆسـتا و دایکـی نەبـوو، چۆنیـش بووە کەسێکی خۆشەویست بەلای هاوڕییەکانییەوە کە پابەندی ئامۆژگاری مامۆستاکە بوو، هەر بۆیە زۆر باشە کە بە قسەی ڕاوێژکاری ئەوانە بکەین کە بە تەمەن لە خۆمان گەورەترن.